# دیوانی ڕەهبەر

## شێخ تەها شێخ سەعید

١٩٠٣ - ١٩٧٣

ساغکردنەوە و ڕاڤەکردن

حەمەزیاد شێخ تەها

نووسینی پێشەکی

د.مارف خەزنەدار

٢٠١٠




ناوی کتـــــێب : دیــــــوانـــی ڕەهبـــەر

بـــابـــــــــەت : شیـــعر

نـــاوی شاعیـــر : شێخ تەها شێخ سەعید

ژمـــارەی سپـــاردن : ١٧٩٤ / ساڵی ٢٠١٠

تیـــراژ : { ١٠٠٠ } دانە - چاپی یەکەم

نــــــرخ : ٢٥٠٠ دینار

## روونكردنەوەیەك :

ئــەم چــا پە كــە لــە تــشرینی یەكــەمی ســالّی ٢٠١٠ بــە ئــە نجام گەیشت .. دوای تەواو بوونی كۆمەلێ هەلّـەی چـاپ و هەنـدی كـەم و كـوورِی و لەبیرچوونم تێدا بەدی كرد ... كـە پێش بە چـاپ گەیاندنی پەلەم تیایـدا كردبوو بۆ ئەوەی خوالێخۆشـبوو (د. مـارف خەزنـەدار) كـە پێـشەكیەكەی بـۆ نووسیبوو ، بە چاپكراوی ببیبینێ .. لەبەر ئەوەی هەموو جـارێ بـە پەرۆشـەوە لێی ئە پرسیەوە ... ئەوە بوو لە ٤/ ١٠ / ٢٠١٠ چـا پەكەی تـەواو بـوو و چـەند نوسخەییێكم گەیاندە خزمەتی بەرلـەوەی لـە ٢٥/ ١٠ / ٢٠١٠ كۆچـی دوایـی بكات ....

لەم بلاّوكراوە ئەلیكترۆنیـەدا ئـەوەی دركـم پـێ كردبـێ لـە هەلّـەی چـاپ و لەبیرچـوون لـە روونكردنـەوە و پـەراوێز، هـەولّم داوە بیاننوسـم و راسـتیان بكەمەوە .. بەو هیوایـەی بـە كـەمترین هەلّـەو كـەم و كوورِیـەوە جـارێكی دی خستبێتمەوە بەر دیدەی خوێنەرانی

لەگەلّ هیوای سەركەوتن بۆ گشت لا یێ

**محمدزیاد طه سعید**

١٥ نیسان / ٢٠١١

ناونیشانی پۆستی ئەلیكترۆنی:
Kameran954@gmail.com

**ئەو بەڕێزانەی کەکتێبەکەیان لەلایە ئەتوانن لە سەر ئەم بڵاوکراوەیە تێبینی ئەو شوێنانە بکەن کە لە خوارەوە دەست نیشان کراوە :**

**١- وشەی ( رووح ) کە بە هەڵەی تایپیێست بوە بە ( ڕۆح ) بە گشتی راستم کردوەتەوە ، ئەگەر لە هەر شوێنیکیش بەر چاو کەوت لەم دیوانەدا ئەوا هەر بە ( رووح ) ئەخوێنرێتەوە .**

**٢- لە هەر شوینێ پیتێك زیاد یا کەم - بە تایبەت ( واو ) ەکان هەڵەی زۆری تێدا بوو - ئەوەندەی درکم پێ کردبێ راستم کردوەتەوە .**

**٣- ئەو شوێنانەی کەم و کورتی تێدا بوە و ئەو پەراوێزانەی کەلیم زیاد کردوە یا لە کتێبەکەدا نیە و ئێستا بە پیۆستم زانیوە ..لەم خشتەیەدا دەسنیشانم کردوە :**

| زنجیرە | راستکردنەوە و تەواوکاری | لاپەرە |
|---|---|---|
| ١ | هەرچەندە لەو( سەفەرانەماندا ) هەندێ جار .... | ٩ |
| ٢ | پەراوێز بۆ پارچە شیعری ( ئەی وەتەن مەحروومی گەشتی ) | ٣٥ |
| ٣ | نیشانەی ( فەخرە هەر کوردێ ) لە رێی .... | ٣٧ |
| ٤ | لە هەر لایێکە ( سەر دانێم ) کە ببمە ..... | ٥١ |
| ٥ | خوێنی گەش ( بپڕژێنەوە ) | ٥٦ |
| ٦ | گەر ( قەدەم رەنجە ) بکەی ...... | ٥٨ |
| ٧ | پەراوێزی سەرگوزشتەکەم لە سێ پەراوێزەوە کردوە بە پێنج | ٨٤ |
| ٨ | لە سوحبەت عومری ( بێ وەفایی ما ) | ٩٦ |
| ٩ | پەراوێزێکم بۆ وەرگێڕانی چوارینەکانی خەیام زیاد کردوە | ٩٨ |



سالّی {١٩٤٦} بە کامیرای گیوی موکریانی گیراوە

لە شاری هەولی

# ناوەرۆک

# پـــێـشــــەكــی

بە قەڵەمی

## د. مارف خەزنەدار

- ١ -

شێخ تەها شێخ سعید دۆستێکی نزیکی ماڵی ئێمە بوو ،لە کەرکووك دەژیا . ماڵی ئێمە لە سەردەمی میردمنداڵیم دا سەفەرمان بۆ کەرکووك زۆر بوو ، سەفەری شێخ تەها بـۆ هـەولێر لـەوەی ئێمـە کـەمتر بـوو. هەرچـەندە لـەو سـەفەرانەماندا هەنـدێ جـار دەبووین بە میوانی ماڵی شێخ تەها.

بۆ ناسینی ئەو کەسەی ئێمە بە شاعیر ناوی دەبـەین، پێویـستە ئـەو دێرانە بخوێنینـەوە کەشێخ تەها لەبابەت ژیانی خۆیەوە نووسیویەتی.لـەناو ئـەو زانیاریانـەدا ئـەوەمان بـۆ دەرئەکەوێ هەر لە منداڵیەوە بەبێ دایك و باوك گەورە بووە . کۆچی نـاوەختی ئەمانـە ناسۆری ژیانیان بۆ کوڕیان بەجێ هێشتوە، لەسۆزی نزیکترین کەس بێ بـەش بـووە. ئینجـا کەس و کـاری، ئەوانـەی پێویـست بـوو بـبن بـە دایـك و بـاوك بـۆی بـوون بـە دوژمـن و بەربەرەکانیان کردووە.

ئەم دیاردەیە لە پەروەردە بوونی شێخ تەها بووە بە هۆی ئەوەی ژیـانی نالـەباری خـۆی لـە چارەنووسی نەتەوەی کورد ببینێ، واتە خۆی و کوردەکەی هەردووکیان بەد بەختن، بەلام کـە بـە تەمەن گـەورە بـووە بەد بەختیەکەی خۆی لەبیر چۆتەوە و بەدبەختی میللەتی کورد لـە شیعری دا رەنگی داوەتەوە .

- ٢ -

شیخ تەها لە زووییێکەوە دەستی کردوە بە شیعر هۆنینەوە و نازنـاوی (رەهبـەر) ی بـۆ خـۆی هەڵبژاردووە، بەلام خۆی وەکو شاعیرێك دەرنەدەخست، نەیدەگوت من شاعیرم ! پێـی خـۆش نەبوو داوای شیعری لێ بکەن، لەبەر ئەوە تـا ئێستاش بەگوم نـاوی مایـەوە،کەچـی شـیعری جوانی وای هەیە لە پلەییێکی ئیستێتیکی ئەوتۆدایە رێگـەی بـۆ خـۆش دەکـەن بـچێتە نـاو {مێژووی ئەدەبی کوردی } یەوە.

له گوڵبژێر کردنی دنیای شیعری ڕەهبەر ئەگەر چی کەمیشە کۆمەڵێك شیعرمان دەست دەکەوێ لەو بابەتانەی شیعری کلاسیکی کوردی خەریکین . لەم ماوەیەدا نموونەی ناوەڕۆکی هەندێ لەو شیعرانە دەخرێنە ڕوو.

- ٣ -

ڕەهبەر لە شیعرێکی نیشتمانی دا زیاتر لە لاواندنەوە دەکا دەڵێ:

ئەی وەتەن مەحروومی گەشتی گوڵشەن و سەیرانتم
مردوویی دەستی غەریبی و بێکەسی لاوانتـــــــم

ئەم دەست پێ کردنە ئەوە دەخاتە ڕوو دوا کەوتوویی کورد کێشەی هەرە گەورەی شاعیرە، لەبەر ئەوە دەڵێ :

خوێن لە چاوم دێ لە باتی ئەشکی حەسرەت دائیما
چونکە هەر جارێ دەبینم دیلی دەست دوونانتـــم

سەیری گوڵزارت ئەکەم هەرچەند مەتاعی دوژمنــە
خۆم لە قوڕ هەڵنێم کەمە جا قۆچەکەی قوربانتم

ئەم شین و شەپۆڕە بە لای شاعیرەوە بۆ میللەت ئەگەر چی پێویستە، بەڵام دواکەوتوویی لە جێی خۆی نیە، لەبەر ئەوەیە دەڵێ :

کەی دەزانی لاوی من جوگرافیا و تأریخی کورد
ڕۆژ و شەو مەشغووڵی حەرفی زیکری یا کوردانتم
کوردە تا کەی بێکەسی هەڵسە کە عەسری بیستەمە
ئەی بە قوربانی سوپاهی ئاری و بابانتـــــــم

بیری کوردایەتی لە ڕۆژگارانی سەدەی بیستەم دا تا سەر ئێسقان کاری لە ڕەهبەر کردبوو لە هۆنینەوەی شیعری سیاسی دا، لەمەدا هەندێ جار تەعبیر و لێکسیکۆنی سوفیزم بەکار دێنێ، بەوەی لە باتی زیکری (یا حەی ...) زیکری یا (کوردان ...) دەکا،

- ٤ -

مەیدانی غەزەل و دڵداری لای ڕەهبەر ئاوەدانە، هەندێ جار وەستایەتی دەنوێنێ کە لاسایی مامۆستایانی غەزەلی قوتا بخانەی نالی دەکا لە ناوچەی سلێمانی ... لە غەزەلێکی دا دەڵێ :

هەڵدەوە سەرپۆشی ڕوو تا دەرکەوێ ڕۆژی مونیر
کافری زوڵفت لە بەر چی مەنعی گوڵزارم ئەکا

ئەم وێنەیە بێ گومان لە بەرهەمی گەلی لە شاعیران دەبینرێ وەکو حەقیقەتێك وەك ئیدیۆم خۆی دەنوێنێ، بەلام ڕەهبەر و شاعیرانی دیکە بۆئەو حەقیقەتە ئاسۆییێکی جوانکاری دیکە دروست دەکەن ... هەر لەو غەزەلەدا ڕەهبەر دەڵێ :

ڕەوزەیی سینەت لە کافر مەنعە، ئیسلامم ئەمن !
بۆ ئیشارەی {فادخلوها} مەنع و ئینکارم ئەکا
قامەتی ئەلفت لە دووری، (ڕەهبەر) ا وا بۆتە دال
چاوی پڕ فیتنەی نیگاری تازە دووچارم ئەکا

ئەم دێرانە و هەموو غەزەلەکە لە ڕووی زمانەوە گشتیان دەچنە ناو ئەو فەرهەنگەی ووشە و زاراوە و تەعبیر و لێکسیکۆنی غەزەلی کلاسیکی دەگرێتە خۆی .

- ٥ -

لە غەزەلێکی دیکەدا ڕەهبەر بە هەناسەییێکی سۆفیزمانە بە شوێن حەقیقەت دەکەوێ، هەموو دێرێکی شیعرەکە بە (شەرتە) دەست پێ دەکا، بە زۆری لە نیوەی یەکەمی دێڕەکەدا وێنەی ڕووداو دەگرێ و لە نیوەی دووەمیدا دژی دەوەستێ .ئیتر بە شێوازی ڕەوانبێژی شیعری

میللـــەتانی ڕۆژهـــەڵاتی ناوەڕاســـت دەكەوێتـــە نـــاو گێـــژاوێك ســـنوور لـــە نێـــوان سۆفیزم{تەریقەت} و شەریعەت {ئایین} نامینێ. ئەمە دیاردەییێكی سەلمێنراوە لـە شـیعری كلاسیكی دا و هیچ گێروگرفت و هەڵوێستی دژ بە یەك دروست ناكا ... لە هەندێ دێـڕی ئـەو غەزەلەی، ڕەهبەر دەڵێ :

شەرتە وەك مەجنوونی ڕیسوا ڕوو بە كەژ ، دێوانە بم
ڕۆژ و شەو عەوداڵی لەیلا وهەم دەمی وەحشانە بم
شەرتە وەك پەروانە دایم ڕوو بە ڕوویی شەمعەكـــــەت
ئاگرێ هەڵكەم لە خۆم ئەو سا فیدای جانانە بم
شەرتە وەك (ئازەر) خەریكی بت پەرستی قەومەكـەی
پشـت بە زیننار ڕابوەستم، نۆبەچی بتخانــە بم
شەرتە تـا عومرم بمێنێ ڕوو لە تەقوا و دیـن نەكـەم
یا وەكو پیری موغان خۆم حاكمـی مەیخانـــە بم

- ٦ -

لە ساڵی/ ١٩٥٦ شێخ مەحموود لەبەغدا كۆچـی دوایـی كـرد و تـەرمی برایـەوە سـلێمانی و لـــــە مزگەوتی گەورە نێژرا . لەو سەردەمەدا زۆربەی شاعیرانی كوردزمان ماتەمنامـەیان بۆ نووسی ... ئەگەرچی ماتەمنامەكەی محەمـەد ســاڵح دیـلان سەرپـشكی هـەموویان بــوو لەڕووی جوانكاریەوە ... بەڵام ئـەوانی دیكەشبۆچـوونی قەشـەنگیان هـەبوو ، دیــارە ئــەو ماتەمنامانە هەندێكیان لـــە سەر بـەحری عـەرووزی و یـەكێتی قـافیـە هۆنرابوونـەوە ، هەندێكی دیكەیان بە شێوازی شیعری نوێی خۆماڵی بــە كـێش و قـافیـەی ڕەنگــا و ڕەنگـەوە خۆیان دەنواند.

سۆزی ڕەهبەر بۆ كۆچی شێخ مەحموود بزووت، لە چوار چێوەی شیعری عەرووزی كلاسـیكیدا توانی وێنەی جوان بەرجەستە بكا بۆ ناسینی ئەو سۆزە بە كوڵە . ئیتر شیخ مەحموودی وەكو

سەردارێكی قەومی كورد و دەروێشێكی تەریقەتی قادری خستە ڕوو . لە هەندێ لە دێڕەكانی ئەو شیعرەدا دەڵێ :

کۆچی کرد،وا زوو لە دنیا  پێشڕەو و سەرداری کورد
داخەکەم بۆ تاقە سواری قەومی بێ غەمخواری کورد
کوا چرای شۆرشگەریمان بۆ گەلی کورد لە عیـــراق
کوا گوڵی ئاواتـــی دوور و شوعلــەیــی ئەنواری کــورد

پێش ئەوەی کۆتایی بەم  پێشەکییە بێنم  پێویستە سوپاسێکی بێ  پایــان  پێــشکێش بــە ( حەمە زیاد ) ی کوڕی شێخ  تەها ی ( ڕەهبەر )  بکەم ئەو کوڕە بــە ئەمەکــەی خۆشەویــستێکی نزیکی باوکی لە بیر نەکردووە و ویستوویەتی ناوی منیش بچێتە ئەم کتێبــەوە . هــەر وەهــا سوپاسی دەکەم بۆ ئەو هەوڵ و کۆششەی خەر جــی کــردوە لــە  پێنــاوی بــڵاو کرنــەوەی ئــەم یادگارە، ئەوەی بێگومان دەبێتە سەرچاوەییێکی دیکە بۆ نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کــوردی .

هەولێر : مەڵبەندی ڕووناکی
مارف خەزنەدار
٢٦ ی مایسی / ٢٠١٠

# وتەیێکی پێویست

ئەم دیوانە کەئێستا ئەکەوێتە بەردەستی خوێنەران ئەگەربارودۆخی کوردستان بەگشتی و کەرکوك بەتایبەتی بەوجۆرەی کەهەموو ئەیزانین نالەبار نەبوایە دەبوو لەمێژە بە چاپکراوی لەبەردەستماندا بوایە .

دەستنووسی ئەم دیوانە چەند جارێك هەوڵی لە چاپدانی دراوە .. ڕەهبەر لەژیانی خۆیدالەساڵی (١٩٧٠) لەلای خوالێخۆشبوو (گیوی موکریانی) کە خاوەنی چاپخانەی کوردستان بوو لە هەولێر و لەکۆنەوە برادەر بوون، دانابوو بەونیازەی کەبۆی چاپ بکات .. ماوەی (٣)ساڵ لەلای مایەوە و هەرچاپ نەبوو- کە بە راستی ئەو چەند ساڵە کاتیکی لەبار بوو بۆ چاپکردنی – مایەوە تاکو هاوینی (١٩٧٣) ... ئەو کاتە هەر چەند مانگێك بەسەر مردنی شاعیرەکەدا تێپەڕ بووبوو .. ئەوەی راستی بێ من لەفەوتان و بزر بوون ترسام ، لەبەر ئەوە چووم بۆ هەولێر و لەگەڵ جەنابی موکریانی قسەم کرد و داوای ئەوەم لێ کرد کەکاتێکمان بۆدیاری بکات بۆچاپکردنی .. یاخود بماندتەوە بۆئەوەی خۆمان چارێکی بۆبکەین . ڕەحمەتی بەهەردوو ڕێگاکە توند بوو، خۆی توڕەکردو وتی ئێستا لەناو ئەوهەموو لاپەڕە و دەستنووسە پەرش و بڵاوانەدا بۆم نادۆزرێتەوە .. سبەینێ وەرە وەریگرەوە ! بەڵام ناو و شیعرەکانی لەمێژووی ئەدەبیاتی کوردستان دێنمەدەرەوە! وتم : تاکو ئێستا لەهیچدا ناوی نەبوە !... بالەوەشدا هەر نەبێت *.

---

*لە هەشتاکاندا ئەو(کتێبە مەوعوود) ە کەوتە بازارەوە و مامۆستا( گیو) تیایدا بەڵێنەکەی خۆی بەجێ هێنابوو ! ئەگەر چی کورتەی ژیان و نموونەی شیعرەکانیشی لە کن مابوو ، لە گەڵ گەلێ شیعرو نووسراو و لاپەڕەی تریش کە ئەگەر ئێستا لە بەردەستماندا بوونایە ئەما نخستنە دیوانەکەوە .. بە هەرحاڵ ، .......... لە نیوە بگەڕێتەوە قازا نجە ..

ئەوەبوو بۆ سبەینێ بەیانیەکەی چووم و لێم وەرگرتەوە و داوای لێبوردنیشم لێکرد و بۆشم دووبارە کردەوە کەمن وای بەباش ئەزانم لەلای خۆمان بێت . لەبەهاری (١٩٧٤) دیسان باری کوردستان بە جۆرێ تێکچووەوە نەك چاپکردن بەڵکو هەر نەمانئەزانی لەکوێ بیشارینەوە .
لەساڵی/ ١٩٨٦ خوالێخۆشبوو مامۆستا (اومێد ئاشنا) کە هاوڕێم بوو جارێك پێی وتم : بۆ نامدە یتێ کاری تێدابکەم وئەگەر بواریشمان بۆ رەخسا ئەوا چاپی ئەکەین ! وتم بۆچی .. نا ؟ من خۆم حەزناکەم ئەوکارەبکەم بۆئەوەی نەڵێن لایەنگریی تێداکردوە، کەسێکی دی ئەو ئەرکە بەجێ بهێنێ باشترە .
ئەوەبوو ماوەی ساڵێك مایەوەلەلای، گشتی نوسیبووەوە و پەراوێزی بۆکردبوو بەلاّم لە(نوسینەوەو بۆچوون و پەراوێز) دا هەڵەی زۆری تێدابوو، ئەوەش بەهەرحاڵ قابیلی چاك کردن بوو، بەلاّم بارودۆخی خۆم وخێزان و بەگشتی کوردستان ،بەربەستی گەورەبوون بۆ چاپکردنی ...لەدوای ڕاپەڕینیش، کەرکوك کەبنەمای ئەوشیعرانەیە ٠٠ بەبێ ئازادی ئەوشارە ... بلاّوبوونەوەیان بایەخێکی ئەوتۆی نەدەبوو ...

بەکورتی من (ئێستا) بەکاتێکی لەبار ئەزانم،بەتایبەت پاش بلاّوبوونەوەی کتێبەکەی دکتۆر مارف خەزنەدار (رۆژگاری من)، کەچەند یادگارییێکی باس ئەکات و وێنەییێکیشی لەکتێبەکەیدا داناوە ، من خۆم دوای ئەوەی لە رێگای هاوڕێم کاك (ئازاد عبدالواحد) ەوە لەگەڵ جەنابی دکتۆر مارف قسەم کردو پێشنیازی ئەوەی بۆکردم : من ئامادەی بکەم وجەنابیشی پێشەکی بۆ بنووسێ .
بەوجۆرە من کەوتمەخۆم و دەستم کرد بە ساغکردنەوە و خستنەسەر ڕێنووسی سەردەم ، هەندێ وشە نەبێ کە پێویستی کردوە وەك خۆی بمێنێتەوە بۆئەوەی مانای نەشێوێ .. دوای نووسینەوەی شیعرەکان و رێکخستنیان بە گوێرەی بابەت، بەم شێوازە کەوتمەکار بۆ هێنانە بەرهەمی ئەم دیوانە :

١) نووسینەوەی کورتەییێك لە ژیانی،لەژێر ناوی (رەهبەر و بنەماڵەکەی) وەکو تەواوکەرێك بۆ سەرگوزشتەکەی خۆی .

**٢ ) نووسینەوەی کورتەیێك دەربارەی شیعرەکانی لەژێر ناوی ( رەهبەر و شیعر ) کە بە گشتی لەسەر شیعر و پەیوەندی رەهبەر بە شیعرەوە دواوم .**

**٣ ) ریز بەندی بابەتەکانم بە گوێرەی ژمارەی شیعرەکان ( لەزۆرەوە - بۆکەم ) داناوە .**

**لە کۆتاییدا ئەوەی کە ماوەتەوە پەیوەندی بە رەهبەرەوە هەبێ، بەم شێوەیە کردم بە پاشکۆی دیوانەکە :**

**١- سەرگوزشتەی ژیان ... ساڵی/ ١٩٣٩ بە قەڵەمی خۆی .**

**٢- بەشێك لەچوارینەکانی عومەری خەیام/ وەرگێڕان .**

**٣- ( قرە باش ) ... لە بنەڕەتدا دەقێکی تورکی یە، وەرگێڕانەکەی بۆ سەر زمانی عەرەبی بریتیە لە پێنج لاپەڕە... کە دەسنووسەکەم وەکو خۆی داناوە، لە بەر ئەو هۆیانەی لە پاشکۆکەدا باسم کردوە .**

**٤– وێنە و دۆکیۆمێنت ...**

**١ ) هەندێ وێنە لە قۆناغە جیا جیاکانی تەمەنیدا گیراوە ..**

**٢ ) ئەو دۆکیومێنتانەی کە ئەبن بە بەڵگە بۆ راستیی هەندێك لە قسەکانمان ..**

**٣ ) چەند دۆکیۆمێنتێك کە پەیوەندیی بە خانەوادەکەیانەوە هەیە .**

**لەڕاستیدا ئەوەندەی کە لە بەردەستمدا یە و ئەوەی لە دەستم هاتوە، ئەمەیە کە ئەیخەمە بەردەستی خوێنەران .... هیوا دارم - کەم تا زۆر- لە مەبەست نزیك بووبێتمەوە و رووزەردی لای شارەزایان و خوێنەرانی ئەدەبی کلاسیکی و گشت خوێنەرانی ئەدەبی کوردی نەبووبم ...**

**حمە زیاد شێخ تەها**

**سلێمانی – گەڕەکی بەختیاری**

**مایس/ ٢٠١٠**

# رەهبەر و بنەماڵەکەی

شێخ طه کوڕی شێخ سعید کوڕی شیخ خدر .. ساڵی (١٩٠٣) لەگەڕەکی (امام قاسم) لەکەرکوك لەدایك بوە، لەتەمەنی یەك ساڵیدا باوکی کۆچی دوایی کردوە و لەتەمەنی حەوت ساڵیدا دایکیشی کۆچی کردوە٠ ئینجا کەوتوەتە بەرشەقی رۆژگار و کەس و کار ..بەرەی باوکی لە (امام قاسم) بوون وبەرەی دایکیشی لەگەڕەکی (أخی حسین) کەئیستا پێی ئەوترێ (حەسیرەکە) .. منداڵێکی بەستەزمان لەنێوان بنەماڵەی باوك وبنەماڵەی دایکیدا ئەمسەروئەوسەریان پێ کردوە .خۆی لە سەرگوزشتەکەیدا بەدرێژی باسی ئەو تاڵی و ناخۆشیانەئەکا ... ئەتوانین بە ڕاشکاوی ئەوە بڵێین کەئەم پیاوە (عصامی) بوە و خۆی خۆی دروست کردوە .

لەگەڵ ئەوەی کەخاوەنی دووبنەماڵەی گەورە ودەست ڕۆیشتوو بوە ! بەلام لە لای هیچیان نەحەواوەتەوە ٠٠ بە مەرجێ هەردوو لایان ناوبانگی چاکە و پیاوەتیان هەبوە ، بەلام لەوە ئەچێ تەنها بۆ ناو چاکەیان کردبێ!..بەخێوکردنی کچەزا یاخود برازا ناو و ناوبانگی پێ پەیدا ناکرێ .. لەبەر ئەوە هیچ لاییکیان نەیان گرتوەتە خۆیان ..

لە بنەماڵەی دایکی .. (سەید محمد ئاغا) دانیشتوی کەرکوك و کەسایەتی ناودار لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەمدا لە شاری کەرکوك نیشتەجێ بوە، وەچەکانی خوێندەوارولە دەوڵەتی عوسمانلیدا کار بە دەست بوونە، (سید احمد) کەلەدایکەوە باپیری شێخ تەهایە.. یەکێ لە کوڕەکانی بوە، ماوەییێك لەماڵی ئەواندا ماوەتەوە .. لە جیاتی ئەوەی وەکو یادگاریەك کەلەکچە (جوانەمەرگەکەی) بەجێ مابێ .. تەماشای بکا .. بە پێچەوانەی ئەوەوە ڕووی نەداوەتێ و دەری کردوە .

بەلام لەدوای مردنی باوکی کە (شێخ سەعید) بوو خوێندەواری لەبنەماڵەی باوکیدا بەرەبەرە پووکایەوە، ئەو مامەشی (شێخ جواد) کەلە سەرگوزشتەکەدا باسی ئەکا تەکیەکەی کردوە بە مزگەوت و پێش نوێژی تێداکردوە و زۆر تاقەتی علومی دینی نەبوە ، زیاتر شارەزایی لەکیمیاگەریدا هەبوە و لەو بوارەدا پیاوێکی زیرەك بوە ٠ تەنانەت توانیویەتی پارەی ئەو سەردە مە دروست بکا بە ئامێری دەستی ساکار بەمەرجێ معد ن بووبێ ٠ وەکو باوکم باسی ئەکرد، لەگرانیەکەدا، بەو کارە گوزەرانی کردوە ٠

**شێخ سعید کەجێگری شێخ خدری باوکی کەدروستکەری ئەوتەکیەی ( نەقشبەندی ) یە بوە لەکەرکوك، بەمردنی ئەو تەکیەکە کوێر بوەتەوە و تەنها ناو و یادگاری لەلای ئەوکەسانە ماوە کە مریدی تەریقەتی نەقشبەندی بوون لە کەرکوك ، ئیتر نەخەلوەت و زیکری تێدا کراوە و نەشۆربای تێدا خوراوە .**

**شێخ سعید جێگرێکی لەباری باوکی بوە و توانیویەتی خەلکێکی زۆر لەسەر تەریقەتەکە بهێلێتەوە و پەرەی پێ بدا ،بەلام بەمردنی کوت وپڕی ئەو، تەکیە ئەمرێ و تەریقەتەکەش کز ئەبێت و بەرە بەرە نامێنێ لە کەرکوك ٠ لەقەسیدەیێکی شێخ ڕەزای تالەبانیدا بەتورکی لەژێر ناوی ( نقشبند یلر ) مەدحی ( شێخ خدر ) ئەکات و بە {خواجە خضر } ( ١ ) ناوی ئەهێنێ وەك چۆن لە لای کاربەدەستانی حکومەتی عوسمانلی بە {خضر افندی} ( ٢ ) ناوی براوە ..**

**شێخ خدر پیاوێکی وابوە کەئەگەرلەشوێنانی دیکە ناکۆکی لەنێوان تەریقەتی قادری ونەقشبەندیدا هەبووبێ ، وە کو لەسلێمانی هەبوە، بۆنمونە نێوان مەولانا خالد و شێخ مارفی نۆدێ یا خود نێوان مەحوی شاعیر و کاك احمدی شێخ، کە گەیشتوەتە ئەوپەڕی ناکۆکی ،بەلام ئەم لەگەڵ تەکیەی تالەبانیدا کە تەریقەتیان ( قادری ) یە ، ئەوسەردەمە شێخ علی گەورە سەرپەرشتیاری تەکیە ئەبێ پەیوەندی زۆرباشی لەگەلیان هەبوە تەنانەت کتێبیشیان بە یەکتری داوە، کتێبێکی پاشماوەی شێخ خدرلەلام مابوو لەسەری نوسرابوو ( هذا ملك علی الطالبانی ) کتێبەکەدەربارەی شێوازی ( أدب و رەخنەی أدبی ) چاپی حجری بوو مۆری شێخ علی لەسەربوو .. تا ئەگاتە سەر شێخ تەها کە ئەویش پەیوەندی و برادەری زۆر خۆش بوو لەگەڵ تالەبانیەکان ،بە تایبەت خوالێخۆش بوو ( شێخ جمیل تالەبانی ) کە سەرپەرشتی تەکیەکەی ئەکرد و لە دوای ئەو ( شێخ علی ) بچووك .**

---

**١ ) خواجە : لێرەدا مانای ( مامۆستا ) ئەگرێتەوە ... مانای دیکەشی زۆرن .**

**٢ ) أفندی : وشەیێکی تورکیە بە مانای: بەرێز – گەورە .. هەتاوەکو سالانی شەستیش لە کوردستان بەمامۆستا ئەوترا أفندی .**

وتمان له پاش شێخ سعید تەکیەی شێخ خدر شێخایەتی تێدانەکرا، لەنێوان بەجێ هێشتنی (ڕەهبەر) بۆکەرکوك وگەڕانەوەی نزیکەی (١٠) ساڵی پێچوە لە (١٩١٥ تا ١٩٢٤) نەگەڕاوەتەوە کەرکوك ٠ دوای گەڕانەوەی لە(کلیەی شریعەی اعظمیة) بەامتحان لە پۆلی دوو وەرگیراوە، کەئەوسەردەمە کۆلێجەکە تازە دامەزراوە، بەلاّم ئەم نەیتوانیوە تیایدا بەردەوام بێت لەبەرئەوهۆکارانەی کەلەسەرگوزشتەکەدا باسی دەکا٠ ئەو مامەی کە (شێخ جواد) ە ڕێگەی نەداوە بچێتە مزگەوتەکەی خۆیان ناچارلەمزگەوتەکانی کەرکوکدا فەقێیەتی کردوە بۆئەوەی پەرە بەخوێندنەکەی بدات وخۆشی بژێینێ لەهەمان کاتدا زۆرهەوڵی خوێندنی ڕەسمی داوە وەك ئەوەی لە (مدرسة محمودالخال) خوێندوویەتی کەقوتابخانەیەکی دینی رەسمی بوە سەر بە دائیرەی ئەوقاف لە کەرکوك .

ئەیگێڕایەوە کەچۆن لەساڵی (١٩٢٧) لە مزگەوتی قەلاّ بوە ضابتێکی گەورەی هیندستانی ویستوویەتی فێری زمانی فارسی ببێت، ئەمیان بۆ دەست نیشان کردوە وەکو یەکێك لەشارەزایانی زمانی فارسی لە کەرکوك ..بەرامبەر بە برە پارەیێك پێی وتوەتەوە کە بۆ ئەو کاتەی ئەم گەلێ باش بوە .. وەك بۆی باس ئەکردم لە(کۆی سنجق)، لەسالأنی (١٩١٩-١٩٢٢) فەقێ ئەبێ، لەسەردەستی کابرایەکی دەباغچی فێری فارسی بوە .. ئەیوت : لە پێناوی فێربووندا ئەچووم بۆ ئەو دەباغخانەیە و گوێم نەئەدا بەبۆنی ناخۆشی ئەو پێستەیە .

وەك وتمان ئەوسالأنەلە (١٩٢٤ - ١٩٢٩) لە زۆر مزگەوتی کەرکوك و دەوروبەری فەقێیەتی کردوە لەلای (مەلا احمدی فرقان) باوکی مەلا جمیل ڕۆژبەیانی خوێندوویەتی، لەلای ( مەلا احمدی مەلاحکیم) خوێندوویەتی کەاجازەی علمی لەو وەرگرتوە .. تەنیا لە مزگەوتەکەی خۆیان نەیخوێندوە لەبەرئەو هۆیانەی کە باسمان کرد .

لەساڵی (١٩٢٩) ژن ئەهێنێت و پاش ماوەیەك کەرکوك بەجێ ئەهێڵێ بۆدێیەکانی ناوتاڵەبانی، لەچەند دێیەك مەلایەتی ئەکا یەکێك لەو دێیانە(بەیانلو) ئەبێ کەئەوسەردەمە بەدەست (شێخ شکور) ەوە ئەبێ وەك باسی ئەکرد پیاوێکی زۆرباش بوە و زۆر ڕێزی گرتوە وچەندساڵ لەوێ گلی داوەتەوە، لەناوتاڵەبانی ئەمێنێتەوە تاساڵی (١٩٣٣-١٩٣٤)، ئەمجارە کەرکوك ودەوروبەری بەجێ ئەهێڵێ وکۆچ ئەکا بۆ بەغدا و لەوێشەوە بۆ خوارووی عێراق لە(١٩٣٤)، وەك خۆی باسی ئەکرد لەمەرکەزی (ناصریە)

وەزیفەییێکی ئەبێ .. لەوێ خوالێخۆش بــوو (مــەلا مــستەفای بــارزان) ئەناســێ .. کەلــەو کاتــەدا ئــەو (دەســت بەســەر) ئــەبێ، ئاشــنایەتی پەیــدا ئەکــەن و وردە وردە متمانــەی خوالێخۆش بوو وەرئەگرێ ...

ئەیووت رێزمانی فارسیم پــێ ئەوتــەوە ، زۆرجــار دووبــەدوو لــەباری هەمیــشە نالــەباری کوردستان وکێشەکانی ئەوسەردەمەی کورد ئەدواین . جارێکیان چوومە ژوورەوە بۆخزمــەتی بە دیار چەند وێنەییێکەوە فرمێسکی ئەسرِیەوە ، یەکێ لەو وێنانــە شــێخ عبدالــسلام بــوو بەسێدارەوە .. لە دوای ناصریە جارێکیش لە بەندیخانــەی (ئــاڵتوون کــۆپری) ســەردانی ئەکا لە ١٩٥٨ کە لە سۆڤیەت گەڕایەوە ، بروسکەییێکی بەخێرهاتنەوەی بۆ نارد، تاکو ئــەم دواییانە وەڵامەکەیمان لە لا مابوو ..لە ساڵی ١٩٧٠ بۆ دوا جار لە (گەلاڵە) سەردانی کــرد و شەوێکیش لە خزمەتیدا مایەوە .

بەبۆنەی ئاوارەیی و دەربەدەریــەوە ئاشــنایەتی لەگــەڵ زۆر لــە پیاوە گــەورەکان پەیــدا کردبوو،وەك خوالێخۆش بوو (شێخ محمودی حفید) ئەو کاتانەی لە بەغــدا (دەســت بەســەر )* ئەبێت ،ئەمیش (مراقب عمل) ئەبێت لە پرۆژەی دروستکردنی یەکێك لە پردەکانی شاری بەغدا لە(١٩٣٦-١٩٣٧) کــەوابزانم لــەرێگای خوالێخــۆش بــوو (محمــود جــەودەت) ە وە ئەوکارەی دەست ئەکەوێ ، ئەیوت گەلێ جار سەر لە بەیانی شــێخ تەشــریفی ئــەهێنا و بــۆ بێــتا قــەتــی تاوێــك ئەوەســتا ٠٠ تەماشــای ئیــشەکەی ئــەکرد و لــە کرێکارەکــان ورد ئەبووەوە، جارێکیان کرێکارێك بەردێکی گەورەی هەڵگرتبوو ! فەرمووی شــێخ تــەها ئــەو کابرایە (لەك) ە، بانگی بکە و لێی بپرسە، منیش کە کابرا بەردەکەی دانا ! بــانگم کــرد و لێم پرسی : لەچ عەشیرەتێکی ؟ وتی : قوربان (لەك) .

---

* سەردەمی پاشایەتی کە پیاوە گەورەکان دووربخرانایەتەوە بۆ شارێك نــەدەبوو لــە ســنووری ئــەو شــارە بچنە دەرەوە ! لە بەر ئەوە پێیان ئەوترا ( دەست بە سەر ) = ( إقامة جبرية ) .

لەســاڵی ( ١٩٣٨ ) وەزارەتــی معــارف پێویــستی بەماۆســتائەبێت وبــەامتحان معلــم وەرئەگرن، ئەچێتەامتحانەوە و دەرئەچێت و ئەبێت بەمعلم لە ناحیەی سەنگەسەر و دوو ســاڵ لەویٚ بەموچــەیەکی بــاش ( معلــم اول ) ئــەبێت، نــازانم لەبــەرچ هۆیــەك لەســەرئەوکارە لا ئەچــیٚ .. لەســـاڵی ( ١٩٤٠ ) ئەگەڕێتـــەوە کـــەرکوك ولـــە أوقـــافی کـــەرکوك بەڕەسمی ئەبێت بە ( امام وخطیب ) .

لەسەرپارچەکاغەزێك کەلەکاتی خۆیدا وەك بۆرە وەسیەتێك شێخ ( خدر ) نوسـیویەتی کـە بەروبوومی باخەکە ( بکریٚ بە وقف )، بــەو مانایــەی کەهەرکەســیٚ +لێــی بخــوا بــەخێری خاوەنەکەی..! لەڕێگای دادگای ئەوسەردەمەوە و لەسەر ئیددیعای مدیری اوقاف و شــاهیدی شێخ جواد خۆی لێکدانەوەییێکی هەڵاوگێڕی بۆ ئەکرێت و مزگەوتەکە و گشت باخــەکانی دەور و پشتی ئەخرێتە سەر دائیرەی ئەوقـــافــی کەرکوك، دوای ئەوەی شــێخ تــەها هــەوڵێکی زۆر ئەدا بۆئەوەی سەرنەگریٚ ..بەڵام هەموو هەوڵ وکۆششەکانی بیٚ ســوود ئــەبن .. نــازانم چۆن ئەو خــانوەی بــاوکی - کــە بــە پــاڵ مزگەوتەکــەوە بــوو – وەرئەگرێتــەوە، کــەخۆی وباوکیشی لەوێدا لەدایك بوون، هەروەها من و ( شەهێن ) ی خوشکیشم .

بەڵام ئەو مامەی هەر لەدژایەتی کردنی بێزار نابیٚ !.. هەر بۆئــەوەی شــێخ تــەها ئاســودە نەبیٚ ..خۆیشی زەرەرمەند ئەکات و کارێکی وا ئەکا ( نیشتەجیٚ ) یەکەی هەردوولایان بــدرێت بە دائیرەی اوقاف ... لەگەڵ خانەنشین بوونی باوکمــدا بــە هــیچ جۆرێــك - پەیوەنــدی رەسمی - مان بە ئـــەو مزگەوت وخانووەوە نەما، تەنها گۆڕی ( شــیخ خــدر ) و هاوســەرەکەی نەبیٚ- دایکی شێخ سعید و ئەوەکانی تر- کەلە تەکیەکەی خۆیــدا بــە تەنیــشت یەکــەوە نێژراون .. بەڵام بە داخەوە دوای نەمانی رژێمــی پێــشوو نــاوی دروســتکەری راســتەقینەی خانەقا و مزگەوتەکەیان وەك خۆی دانەناوەتەوە .. ئەوەش ئەگەڕێتەوە بــۆ نزمــی ئاســتی بیرکردنەوەی ( ئەو کەســە ) کە ئەو کارەی بەئەنجام گەیاندوە .

.

هەرچی ( شیخ سعید ) ە لەکاتی خۆیدا کە مردوە - لە بەر هەر هۆییێك بێت - لە تەکیەکـە نەنیێژراوە بەڵکو لە لەناو شوورەی تایبەتی بنەماڵەی خـەزووری کـە ( سـەید احمـد ) ە لـە گۆڕستانی شیخ محی الد ین لە کەرکووك نیێژراوە .

پیێش دەستکاری کردنی ناوەکەی لەلایەن رژیێمی پیێشووەوە، ناوی مزگەوتەکـە بـەم جـۆرە بوو :



ئەمە ئەو لەوحەیەیە کە ساڵەهای ساڵ بە سەر دەرگای مزگەوتەکەوە بوە

دەقەکە بەم شیۆەیە ئەخویێندریێتەوە :

**خانقاه شیخ خضر**

**النقشبندی بناه سنه ١٢٨٢ ه**

**- سنه ١٢٧٧ م*-**

* ئەو ( ١٢٧٧ م ) هیچ پەیوەندییکی بە ( ١٢٨٢ه ) یەوە نیە ! .. هەڵەییێکە سەرچاوەکەی نەزانراوە .



**گۆڕی شێخ خدر و هاوسەرەکەی لە تەکیەکەدا کە موڵکی خۆی بوو**

**لە ١٩٧٣/٢/٢٨ ( رەهبەر ) ماڵئاوایی لە ژیان کردوە و لە هاوسەری دوەمی کە ناوی ( صبرية ) بوە کوڕێك بە ناوی ( حەمە زیاد ) و کچێکیش بە ناوی ( شەهێن ) لە دوای بەجێ ماوە .. ئەمیش دوور لە کەس و کار .. لە گوڕستانی ( شیخ محی الدین ) لە کەرکووك نێژراوە و لەسەر بەردی گۆڕەکەی هەڵکەندراوە:**

**برادەران توخوا کەی..کەمن مردم وەسییەت**
**لە جێگاییێکی بەرزی بمنێن بەقەدروحورمەت**
**بانگ ڕایەڵنە خزمانم لەشار و کوچەو لادێ**
**لەسەر قەبرم هەڵپەڕن بەگۆرانی کوردییەت**

# ڕەهبەر و شیعر

شیعر پێناسەییێکی تایبەت ودیاری کراو ناگرێتەخۆی ... بەڵکو خۆی پێناسەی خۆیەتی ... بەڵام ئەتوانین بڵێین رەنگدانەوەی هەیە :

١- لەلای شاعیر دەربڕینی هەستێکە ،لەهەرکات وشوێنێکدا بێت ،بەوێنەی شیعری یان چەند وشەییێکی (ڕێك)١ و (جوان)٢ کەمانایەك دروست ئەکات وئەیگەیێنێت بەدەرەوەی خۆی .

٢- لەلای (وەرگر)٣ چەند وێنەیەکی شیعری یاچەند ووشەیەکی ڕێك و جوان ئەتوانێ کار بکاتە سەرهەست ونەستی ئەوکەسەو بیهەژێنێت و لە دۆخێکەوە بیباتە دۆخێکی تر*.

کەوابوو(جوانی و ڕێکی)پێویستە وەکومەرجێکی سەرەکی لەشیعردا هەبێ،ڕێکی بۆئەوەی مانایەك ببەخشێ ، جوانیش بۆئەوەی سۆزێك لەلای وەرگر پەیدابکات.

احمد شوقی ئەڵێ :

والشعرُ إن لم يكن ذكرى وعاطفة

أو حكمة، فهو تقطيع و أوزان

---

١ - ڕێك: منتظم : بەرامبەر بە (پەرش وبلاو و بێ مانا یا بێ سەروبەر).

٢- جوان: جوانی وشە: جمال: بریتیە لە ڕیتم وزەنگ ومۆسیقا لەوشەدا کە ئەمانە (سیحری وشە) پێك ئەهێنن .

٣- وەرگر = متلقی: خوێنەر یا بیستەر.

* زۆرجار ئەوەنابێ بەمەرج، چونکە ئەو کارتێکردنە، لەسەر بەرزونزمی ئاستی وەرگر ئەوەستێ .. وەك نالی لەم بەیتەدا ئەفەرموێ:

عمرێکە بە میزانی ئەدەب توحفە فرۆشم

زۆرم وت و کەس تێ نەگەیی ئێستە خەمۆشم

**شیعر لەلای ڕەهبەر دەربڕینی هەستێکە کە گەلێ جاران شێوەی جۆراوجۆر لـەخۆی دەگـرێ ، وەك گەیاندنی بیرۆکەیەك یاخود مەبەستێك یا حەزوخەیاڵێك هەڵقوڵاوی ویژدانی خـۆی لەسەرشێوازی شیعری کلاسیکی کوردی ، هەندێ جارلەسەرکێـشی پە نجـە وهەنـدێ جـاریش زۆرخۆی بەوردەکاریەکانی قافیەوە نەبەستوەتەوە، ئەوجارانە گرنگتر گەیانـدنی مەبەسـت بوە لەلای ئەم ...**

**بەگشتی ئەتوانین بڵێین ماناو مەبەست لەلای ڕەهبەر هەروەها بتـەوکردنی بـیرو نـاوەڕۆك، لە پێشترە لە شێوە و قالب، ڕەنگە ئەو تێڕوانینە لەزۆر جێگا کاری کردبێتە سەر لایـەنێکی گرنگ و بنەڕەتی لەشیعردا کە ئەویش (وێنەیە) هەرچەندە وێنـەی شـیعری بەیـەکێك لـە بنەما سەرەکیەکانی شیعر ئەژمێردرێ، بەلام زاڵ کردنی (مەبەست وناوەڕۆك) بەسەر (شـێوەو قالب) دا لەوانەیە لایەنی جوانکاری کزولاواز بکـا، لەگـەڵ ئەوەشـدا وشـەی ڕێـك وجـوان ئەتوانێت جێگای بگرێتەوە و لەخانەی شیعرنەچێتە دەرەوە ...**

**گەلێ جارئەوەی کەدەری ئەبڕین بریتیەلەوخواست و ئاواتانەمان کـە نەهاتوونەتـە دی .. چ بە شیعر بێت چ بە سکالا چ بە هەناسەی سـارد ... گـشتی هـەر لـە (حەسـرەت) دا کۆئەبێتەوە -٤ .**

**حەسرەتی گەورەی ڕەهبەر دواکەوتوویی میللەتەکـەی بـوو لەگـشت بوارەکانـدا بەتاییـەت نەخوێندەواری وناتەبایی کە دوو هۆکاری سەرەکین بۆدواکەوتن، خەمی سەرەکی ئەو:**

**١.دروست بوونی دەوڵەتێکی سەربەخۆبوو بۆکورد.**

**٢.میللەتەکەی بگاتەئاستی گەلانی پێشکەوتووی دنیا، چونکە بـەلای ئـەوەوە کـورد هیـچی کەمترنیەلەوگەلانەی کەخاوەن دەوڵـەت وئـابووری بـەهێزن ، لـەم بۆچـونانەی دا پـشتی بەمێـژووی کوردوگـەلانی دەوروپـشتی بەسـتبوو، ئەوکەسـەی شـیعرە نیـشتمانیەکانی بخوێنێتەوە خۆی بۆی دەرئەکەوێ کە چەند پەرۆشـی گەلەکـەی بـوە، لێـرەدا مـن نامـەوێ پە نجـەبۆهیچ پارچـە شـیعرێکی ڕاکێـشم یـا لـەکێش وقـەوارەی خـۆی بیبەمە دەرەوە .. من ئەوەیان بۆ خوێنەر بەجێ ئەهێڵم ! ...**

---

٤- لەم دێرە شیعرەی گۆران جوانتر لە خەیاڵمدا نیە بۆ ئەم شوێنە، کە ئەڵێ :

هەرچەند بە بەر میلالی فرەم تەنگە قافیە

عمرێکی خەم هەناسەیەکی ساردی کافیە

وەکو هەر شاعیرێکی کلاسیکی لەگشت بوارەکانی شیعردا وەك ئەڵێن ئەسپی خـۆی تـاوداوە ، ئەوەیان لەتصنیفی دیوانەکەیدا دەرئەکەویٚ ٠

لەبواری غەزەلدا شیعری جوانی هەیەو لە زۆر جێگا بنەماکانی رەوانبێـژی ( البلاغـە ) ی تێـدا بـەکارهێناوە وەك ( جنـاس و طبـاق و هتـد ٠٠٠ ) لەمانەشـدا کاریگـەری شـاعیرە کلاسیکیەکانی پێش خۆی لەسەرهەبوە بەتایبەت ( نالی وشێخ رەزا و حاجی قـادری کـۆیی ) کەئەمانە لەسەرەتاوە بنەماوهەوێن و پاڵپێوەنەری وتنی شیعربوون لەلای ، وەك بۆی بـاس ئەکردم لەتەمەنی چواردەساڵیەوە هـەوڵی شیعرنوسـینی داوە، ئـەیوت یەکـەم جـار بۆخـۆم چەند بـەیتیٚ شـیعرم لە پێـشوازی کەسـایەتیەکدا وتـوە بـەلاٚم ئـەو شـیعرەکەی لـە بـیر نەما بوو، منیش ئەوکەسەم لەبیرنەماوە٠
مزگەوتـەکانی کوردسـتان کەئەوسـەردەمە گـشت بوارەکـانی رۆشـنبیری وخوێنـدەواری گرتبوەخۆی هەرلەبواری دین و فقە و شەریعەتەوە ) بۆ بواری زانستەکانی ( فیزیا، فەلـەك، ریاضیات، منطق وجوگرافیاو هتد٠٠ ) بۆ بواری ئەدەب و فەلسەفە و مێـژوو هتـد ٠٠٠ گـشت ئەمانە مەنهەجی مقرّر بوون لەمزگەوتەکاندا ، کەسیٚ نەیئەتوانی ( اجـازەی مەلایـەتی ) وەربگریٚ ئەگەر ئەو زانستانەی لەسەردەستی چەند مـەلاییێکی زانـای ئەوسـەردەمە تـەواو نەکردایە ٠
ئەم ، جگە لە مەنهەجی مقرر خـۆی خولیـای { زمـان و مێـژوو و ئـەدەب و علمـی عـروض و بەلاغەی هەبوە ، لەئەدەبی کلاسـیکی ( فارسـی و تـورکی و کـوردی و عـەرەبی ) شـارەزایی پەیداکردوە، شیعری زۆربەی شاعیرە گەورەکان وقەسـیدە بەناوبانگـەکانی بـۆ مـن شـەرح ئەکردو شی ئەکردەوە، هەرلە { نامق کمال و عبدالحق حامد و حـافظ و سـعدی و خـەییام و نـــالی و کـــوردی وشـــێخ رەزا و مـــەحوی وحەمـــدی و أبونـــواس و متنبـــی و گەلیٚ لە شاعیرەکانی تر ... باسی ( تاهیر فوئاد ) ی ئەکرد کـە شـاعیرێکی کـوردی خـەڵکی کەرکوك بوو لەتەمەنێکی کەمدا کۆچی کردبوو .

کەرکوك شاعیری زۆرە و زۆربەشیان کوردن ئەگەر بە زمانێکی تریش شیعریان وتبێ .. ئەو باسی زۆربەیانی بۆئەکردم وەك ( شێخ عبدالرحمانی خالصی ) باوکی شێخ ڕەزا و نائب اوغلی و دەدە هجری و ڕەنجوری و شێخ محمدی خالص کوڕی شێخ ڕەزا و گەلێکی تر کەئەمانە هەموویان کورد بوون ولەشاری کەرکوك ژیاون .. ئێستا من کەشکۆلێکم لەلا یە لە دەوروبەری ساڵی ١٩١٥ نووسراوەتەوە کە شیعری زۆربەی شاعیرەکانی کەرکووك ی تێدایە .

لەگەڵ گەلێك لە شاعیراندا ئاشنایەتی هەبوە وەك ( دەدە هجری کە کوردێکی کاکەیی بوو هاوڕێ بوونە و شیعریان بۆیەکتری خوێندوەتەوە . هەر وەها لەگەڵ ئەسیری و تاهیر فوئاد برادەری هەبوە .

لەشاعیرو ئەدیبەکانی سلیمانی لەگەڵ هەندێکیان برادەری وتێکەلاوی هەبووە وەك بێخود کاتێ لەمزگەوتی موفتی لە سلێمانی خوێندویەتی برادەری لەگەڵدا پەیداکردوە ، هەر وەها ( شێخ نوری شێخ ساڵح ) و مامۆستا ( برایم احمد ) کە ماڵیان لەگەڕەکی ( امام قاسم ) بوو لە کەرکوك ..

لەدوای شۆڕشی ( ١٩٥٨ ) پارچە شیعرێکی نیشتیمانی لەگۆڤاری ( شەفەق ) کەلە کەرکوك دەرئەچوو بلاوبوەوە بەناوی ( ئەی وەتەن )، پێشتریش ئەوەندەی ئاگادار بم لەگۆڤاری گەلاوێژ چەند شیعر و نوسینی بلاوکردوەتەوە و ماوەیەکیش - سەرەتای چلەکان - وەکو نوێنەر و پەیامنێریان لەکەرکوك کاری بۆگۆڤاری گەلاوێژ کردوە .

شیعرە دینیەکانیشی کەبریتیەلە ( ٣ ) پارچە پاڕانەوە و مناجاة ..گەلێ جارلە پرسەکاندا لە کەرکوك گوێم لێ ئەبوو، دەنگ خۆشەکانی وەك ( مەلاکەریم و مەلا جەوهەر ) ئەیانخوێندەوە ٠

# شیعرەکان

أ) شیعری نیشتیمانی

ب) شیعری غەزەل

ج) شیعری ویژدانی

د) شیعری ماتەم

هـ) شیعری دینی

## ئەی وەتەن بێ شەوقی رووت

رۆژو شەو غەمگینی تۆم وئەی وەتەن بێ شەوقی ڕووت
بەختە رووحم تاقیامەت والە رێگەی هاتوو چووت
شەو لەتاوت وا حەرامە خەو لەچاوم ناکەوێ
ناسرەوێ ساتێ لەچاوم خوێنی ئەشکی ئارەزووت
کەوسەرە هەم گەوهەرە ئاو و هەوای خاکت وەتەن
بێ تۆ من ژینم لەچی، تامردنم چاوم لەدووت
فەخری کوردە خاکی بەرزت شوێنی کوردە ئەی وەتەن
جێ هەواری شێرو مەردە نیشتمانی قەومی زووت
تاکو گۆڕ ( ڕەهبەر ) لەباسی خاکی بەرزت لامەدە
تێ بکۆشە وابە عەزم وسەربەخۆ بۆهۆزی خۆت

## برادەران وەسییەت

برادەران توخوا کەی، کەمن مردم وەسییەت
لە جێگاییێکی بەرزی بمنێن بەقەدرو حورمەت
بانگ ڕایەڵنە خزمانم لەشار و کووچە و لادێ
لەسەر قەبرم هەڵپەڕن بەگۆرانی کوردیەت

خزمان وقەوم وخوێشم لەدوای مردن یادم کەن
بەجێ بێنن وتارم لەرووی وەعز و نەسیحەت
ئاواتم زۆر لەدڵ ما، هیچیانم چاوپێ نەکەوت
سەد حەیف و زۆرمخابن بۆ قەومی کـــــوردی دواکەوت
گەلی بێگانە هەموو ،لەسەر کورد حاکم و زاڵە
کوردیش ئەسیرو بارکێش پا بەکۆت و لەمیحنەت
زۆر بەتاسەو ئاواتم کە بیبینم ڕۆژی کــــــورد
تاکەی لەتاریکیدا مەحکومی جەور و زیللەت
ئەم چەند بەیتەم بنووسن لەسەر کێلی قەبرەکەم
تابزانن حەماسم بۆقەومی کوردی دواکەوت
سەرو ماڵت فیداکە( ڕەهبەر ) بۆبەرزی وەتەن
هەتاکو سەربەست بژی گەورە و بچووکی قەومت

## وێنەگر

**وێنەگر کە { گیوی موکوریانی } یە لەڕۆژی ١٩٤٦/٩/٥**
**لە شاری هەولێر وێنەمی گرتوە**

وێنەگر وێنەی کەوەرگرتم لەشەوق وسۆزی کورد
بوو بەیادی یادگاری شاعیری دڵسۆزی کورد
ڕۆژی کورد هەم دەوری کورد دەرچوو لەمیحنەت سەدشکور
شەونەما زیللەت بەسەرچوو هاتەدەر فەیرۆزی کورد

لاوی کوردستان هەتاکەی دەست لەژێر بارو ئەسیر
سەد شوکر ئۆخەی کەئەمڕۆ جەژنەیەو نەورۆزی کورد
نەگبەتی کورد وابەسەرچوو نەوبەتی ئازادی یە
یەك بەیەك لاوم هەلەو کەن بابژی هەر هۆزی کورد
خۆت فیدای خاکی وەتەن کە ( ڕەهبەرا ) تا رووی ( لەحد )
بەڵکو دەرچێتن لەزیللەت قەومەکەی ئاڵۆزی کورد

## زەمانی سەربەخۆیی

ئەی برا هەڵسە زەمانی سەربەخۆ و هوشیارە کورد
بۆ نیثاری خوێنی دوژمن حازر و بێدارە کورد
تابەکەی مەحکومی دەستی دوژمنی خوێن خۆرەبێ
وابەدەم تیری جەفاوە لەت لەت و زامدارە کورد
هەڵکە بازوی هەولّ وهیممەت بێرە ساحەی عیلم وفەن
تانەجاتی بێ لەزیللەت قەومەکەی بێ چارە کورد
تابەکەی نوستن لەبەرگی غەفلەت و ئاوارەیی
دەنگی زانستە لەهەرلا بانگ ئەکا هاوارە کورد
نەحس و بەدبەخت و سیاچارە و هەژارە قەومەکەت
خوا بە بەدری مەعریفەت ڕووناکی کـــا دووبارە کورد
قەومی پڕمیحنەت هەتاکەی پڕبەدەم هاوار ئەکەی
ئەی خودا خاکی وەتە نمان بێ کەس و غەمخوارە کورد
سەد سەلاحەددین و دارا و کەی قوبـــاد و ئەردەشێر
سەربەخۆ ژین وئەمێستا بێ سوپاو سەردارە کورد

گەر مونادی تیٚ بفـــکریٚ بـانگی میللی وائەدا

یەك دڵ ویەك بن هەموو ئەی میللەتی ئـاوارە کورد

بۆنەکا ( ڕەهبەر ) بەسەردا خاکی میحنەت دائیمـــا

چونکە دایم دڵ بەئیٚش و دەربەدەر غەمبارە کورد

## بۆ ژیـان گەر نەچیە بەر

قەومی کورد تـاکەی لە پەستی و واهیمەی خەوف وخەتەر

مەعدەنی خـاکت بەدەست ئەغیـارەوە کەوتـۆتە دەر

بوٚتەرەققی بۆتەعـالی بۆ ژیـان گەر نەچیە بەر

سوخرە کیٚش ودڵ بەئیٚش و دەستی زۆرت دیٚتە سەر

ڕووت وقووت و بیٚ مەعـاریف مل کەچ و بیٚ ئیعتبـار

بیٚ حەیـات وبیٚ نەشاط و وا زەلیل و دەربەدەر

بەرگی غەفڵەت داکەنە هەڵسە لەنـاوچەی وەحشەتـا

کەسبی فەنً و مەعریفەت کە بیٚرە مەیدانی هونەر

گەربەنووری مەعریفەت پەردەی جەهالەت لانەدەی

قوربەسەر دائیم بەڕۆژ و شەو ئەسیر و بـارەبەر

میللەتیٚکی بیٚ سوپـاە و حیشمەت وبیٚ ئیقتیدار

چۆن ئەتوانی ئیددیعاکەی گەورەیی بیٚنیتە بەر

( اتحـاد و اتفـاق و اقتصـاد ) ت گەرنەبیٚ

چۆن ئەبیتە خـاوەنی تۆپ وتفەنگ خـاکت بەسەر

پێشکەوە بۆ پێشەوە ئەی میللەتی ئازاو نەجیب
هەڵکە بەیداغی بڵندیت خۆت لە زیللەت بێنەدەر
چەن بەئاواتم کەکورد ( ڕەهبەر ) بەسەربەستی بژی
دەست لەناودەست یەکتری کەن بێنە دەر بۆ شۆڕ و شەڕ

## لاوی کورد بەسیە نیفاق

جەژنەیە دڵشادیە ئەی لاوی کورد بەسیە نیفاق
دەست لەمل یەك کەن لەگەڵ یەك هەوڵ بدەن بۆ ئیتتیفاق
هێندە موشتاقە دووچاوم ئەی وەتەن بۆ لاوی تۆ
لابدەن ڕۆژانی میحنەت لابدەن جەورو نیفـــــــاق
شەرتە بۆ لاوت بەدایم خواردن و بەرگی هەژار؟
ڕۆژی هەوڵە ئەی برا هەڵسن لەخەو وەرنە سیباق
سەیری ڕۆژنامەی جیهان کەی تێدەگەی بێگانەیی
شەرتە بێ بەهرە کە کورد بی ؟ وا زەلیل و بێ وثاق
گەل بەگەل بێگانە ئەمڕۆ هالە ئەوجی ئاسمان
بەسیە ئەی لاوم فیراقت، بەس خەریکی ئیفتراق
عیلم وفەننی قەرنی بیستەم شەرتە لای بێگانە بێ؟
بۆچ لەئایەی ( عَلَّمَ الانسانَ ) هەرئەو تاکە تــاق؟
( ڕەهبەرا ) هەرکەس بەشەر بێ، شەرتەخادم بێ لەناو
بێ بەهاواری گەل و هۆزی هەتا ڕۆژی فـــــیراق

# ئەی وەتەن مەحروومی گەشتی*

ئەی وەتەن مەحروومی گەشتی گوڵشەن و سەیرانتم
مردوویی دەستی غەریبی و بێ کەسیی لاوانتم
خواردنم ژەهراوە، خۆراکم غەمە، بەرگم پەلاس
بۆیەدایم وا خەریکی شیوەنی هیجرانتم
خوێن لەچاوم دێ لەباتی ئەشکی حەسرەت دا یما
چونکە هەرجارێ دەبینم دیلی دەس دوونانتم
سەیری گوڵزارت ئەکەم هەرچەند مەتاعی دوژمنە
خۆم لەقوڕ هەڵنێم کەمە، جا قۆچەکەی قوربانتم
کەی دەزانی لاوی من جوغرافیا و تەئریخی کورد
ڕۆژو شەو مەشغولی حەرفی زیکری یاکوردانتم
کوردە تاکەی بێ کەسی هەڵسە کەعەسری بیستەمە
ئەی بەقوربانی سوپاهی (ئاری و بابان) تم
(ڕەهبەرا)مردم وەسیەت بێ لەباتی شین وزار
بمبەنە سەر گردی (سەیوان) لاوی کورد حەیرانتم

کەرکوك / ١٩٤٥

---

* لە گۆڤاری (شەفەق) کەلە کەرکوك دەرئەچوو ساڵی/ ١٩٥٨ بڵاو کراوەتەوە

# بیٚ وەتەن زیندانە

بیٚ وەتەن زیندانە جەننەت چاو لە غلمانی نەکەم
کولخەنی رضوانە بۆچ من دڵ بە حەیرانی نەکەم
بای نەسیمی صوبحی خۆشی یەك نەفەس گەر بۆم نەییٚ
دەر دەچیٚ رووحم ئیتر خۆم چۆن بە بریانی نەکەم
یەك دەقیقە دابنیشم من لە گوڵزاری وەتەن
بۆ نەبیێم ( پاریس ) و( بەرلین ) یش بەقوربانی نەکەم
ئاوی ساف وئەنگەبین ومیٚوژ و دۆشاوم هەیە
شەرتە قەت شەمپانیا و ویسکی لەفنجانی نەکەم
فەخری کوردستانە ئەمرۆ کوردی زاخۆ و ئامیٚدی
ناکەسم گەر تەرکی کوردی، غەیری خۆمانی نەکەم
ئارەزووی سەرکەوتنت بیٚ ناکرِی ( ماڵی بیلاد )*
بۆچ نەیەم کالاٚو کلاٚشی شاخی کویٚستانی نەکەم
دارو بەردت بۆتە گەوهەر بۆتە مایەی ئەجنەبی
لانەوازی بەسیە تاکەی رِوو لە عیرفانی نەکەم

---

*ماڵی بیلاد :- بەکالاٚ و کەلوپەلی بیٚگانە دەگوترا

غیرەتە ئەی کورد هەتاکەی دەست لە ژێر بار و ئەسیر
بەس نیە وەحشەت هەتاکەی ڕوو لە ئینسانی نەکەم
زۆربەئاواتم ببینم (ڕەهبەرا) کوردی هەژار
لابدەن جەهل ونەزانین حەیفە شوکرانی نەکەم

## بڵێ کوردێکی بێکەس

کەمن مردم وەسیەت بێ بەدەس کردی وەتەن کفنم
بکەن بم نێژن وتابۆم ببێتە شاهید و شـەئنم
مەلا گەر بێتە سەر قەبرم لەباتی وەعزو تەڵقینم
بڵێ کوردێکی بێ کەس بوو شەهیدی حادسەی کەونم
نیشانەی فەخرە هەر کوردێ لەڕێی بەرزی وەتەن کوژرێ
بەبەرگی خوێنەوە بڕوا بڵێ مەم شۆن بکەن کفنم
مەتاعی جیفەی دونیا هەتاسەر بۆکەسێ ماوە؟
کەوابوو سەرفی کەم چاکە لەڕێی خزمەت هەموو زەینم
چەنێ ڕووزەردیە بۆمن ئەگەر بمرم بەبێ خزمەت
لەباتی ڕەحمەتم بوٚبێ لەهەرلاوە بکەن لەعنم
نەشاطی ژینی هەرلاوێ لەڕێی بەرزی وەتەنیایە
فیدای خاکی وەتەن ڕووحی نەکا ئەوسا نەڵێ مەزنم
وەتەن ئاوارەیە! تاکەی ؟ خەریکی بەرزی قەومت بە
بەسەرخە (ڕەهبەرا) قەومت هەتاکو بێتەوە جەژنم

# ئەی وەتەن هەرچەند کە دوورم

ئەی وەتەن هەرچەند کە دوورم من لە سای سەیوانی تۆ
ڕوح بەدایم هـــالەخزمەت ، چاوەڕێـــی فەرمانـــــی تۆ
چاو و دڵ پۆشراوە چی بـــکەم چاوەکـــانم نابینـــــێ
تـانەهێنێتن سەبـــا نامەی گوڵ و ڕەیحانــــی تـــۆ
ساوەرە قـاســـید بەرە بۆدولـــبەرم نـــامەی فیراق
پێی بڵێ دایم حەزینە بولبولی خۆش خوانـــــی تۆ
پیر بوە هێزی دڵم بێ هەم دەم وهەم یارمەتی
زەحمەتە سەرپێ کەوێ وازوو لەبەر هیجرانــــی تۆ
مات وحەیرانم کەدایم گیرۆدەی دەستی غەمم
چونکە بێژراوە بەسەرما خاکی غەم بارانــــی تۆ
قەت نەبوو غافڵ لە( ڕەهبەر )چاوی پڕفیتنەی نیگار
دەیکوژێ پێشی دەڵێ دڵ قەفنەس و بریانــــی تۆ

کەرکوك ١٩٤٧

## زوڵمەتی شەو وا بە سەر چوو

هەڵسە ئەی دڵ مژدەبێ وا لاوی کوردان هاتەوە

زوڵمەتی شەو وابەسەرچوو دەووری ( بابان ) هاتەوە

موددەتێکە یەعقوب ئاسا دڵ بەزامی سەختەوە

سەد شکور وا یوسف ئەمڕۆکە لەزیندان هاتەوە

حەسرەت وجەوری فیراقت ڕیشەمی هێنایەدەر

حمدللە بۆتەداوی دەردی، لوقمان هاتەوە

دیدەیی ئەشکم بەدایم مەوجی تۆفانی ئەدا

وشکە ئێستاکە کەدیتی شۆخی ڕەندان هاتەوە

لازمە شادی لەسەر گە نجان ولاوانی وەتەن

( ڕەهبەرا ) وەعدەی ویساڵە ڕۆژی ڕوو نمان هاتەوە

## لافی چیتە بۆ وەتەن

لافی چیتە بۆ وەتەن تۆ بەم سدارەی لارەوە

مەعدەنی ئاڵتون وزیوت وابەدەست ئەغیارەوە

پەرچەم و شانە لەگەڵ مادامە ئەمڕۆ باوە، لات

چیت بەسەر عیلم و مەعاریف کردەوەی باڵدارەوە

هیممەت وسەعیت هەموو هەر عارەقەو شامپانیا

پەشمە لای تۆ فکری میللی ڕووبەڕووی خوێن خوارەوە

سەد کەڕەت بێت وموئەززین بانگی میللیت بۆبدا

تەرکی ناکەی سینەماو دانست لەگەڵ مەی خوارەوە

ناوی خۆت ناوە مونەووەر پێم بڵێ لەم بەینە چیت

هەروەکو ئەلمۆدە ڕازاوەی لە ژێر دڵدارەوە

باعیسی فەخرە لەناو هەر میللەتێ ( ڕەهبەر )، وەتەن

لازمە هەستی لەبەرگی وەحشەت و ئاوارەوە

کەرکوک ١٩٤٨

## کوردی بێچارە

کوردی بێ چارە هەتاکەی مل کەچ وبێ حورمەتی

ڕووت و پێ خاوس لە ناوا لانەواز و سەرپەتی

کوا ژیانت کوا ویقارت کوانێ ئاسار و نیزامت

کوا لەکوێ ما ( گەنجەکانت ) تۆلەلای خۆت دەوڵەتی

قیبلەیی ڕۆم وعەجەم بووی و بەچەی ( بابان ) یان

ئێستە بوویتە مەخسەرەی عالەم لەهەرلا لەت لەتی

کواخەزێنە و موڵك ومالْت کوانێ سەرکردەو سوپات

کوا لەکوێ ما ئیقتدارت بەسیە تاکەی نەگبەتی

دوانزه مليۆنه نفوست گەربە چاو وردبيتەوه

حەيفه جێگات چۆڵه ئێستا بۆچی وا بێ شەوكەتی

بەس نيه( ڕەهبەر )كەكوردی ڕۆژی هەوڵ و هەڵمەته

شەرته تامردن ئەسيرو سوخره كێش و پەت پەتی؟

## مۆبيليام له چی

بێ جەفای خاری وەتەن ! من كاكه مۆبيليام لەچی

بێ سەفای شاخی بڵندی قەسرو كەهرەبام لەچی

نامەوێ گەر بمدەنێ تاجی شاهەنشاهی برا

بێ وەتەن شەرته نەخوازم، قەيسەر وكيسرام لەچی

ژينی خۆم ناوێ بەبێ ژينی برای هاونيشتمان

چيم بەسەر ڕاديۆ و ويسكی شەوكەتی دنيام لەچی

فەخره بۆمن گەرلەبەركەم كاكه دەستكردی وەتەن

نامەوێ كردی ( بيلاد )ی ئەتڵەس وغارام لەچی

كوا تەبيبێ هاوزمانێ زامی كورد تيمار بكا

ئەی خودا لوتفێ هەتاكەی شۆڕش وغەوغام لەچی

خۆت فيدای خاكی وەتەن كه ( ڕەهبەرا ) بۆقەومی كورد

حەيفه دايم ڕوو لەميحنەت سەروەتی ( دارا )م لەچی

# كورد كه مێژووی شاهیده

كورد كەمێژوی شاهیده بۆسەربەخۆیی وكردەوەی
یەك بەیەك بابۆت بەیان كەم تادەگاتە دەوری كەی
خاوەنی حوكم وعەدالەت خاوەنی جەنگ وجەدەل
خاوەنی سككەو سوپابوون تابتوانی حەزبكەی
زۆر بەئاواتم كەیەزدان ئەم گەلە زوو سەربخا
بێتە ڕیز وەك گەل لەناو بێگانەفەخری پێ بكەی
گەل بەگەل بێگانە قوربان والە ئەوجی ئاسمان
تۆهەتاكەی دەست بەتەسبیح وسیواك وحەی دەكەی
دەستی غەیره غیرەتە میوەی ژیانت ببچڕی
خۆت وگەل هەروا ئەسیرو بۆ ئەم وئەو ئیش بكەی
عالەمی غەیره هەموو وا ئاسمانت كەشف ئەكەن
تۆهەتاكەی خاڵ وخەتی دولبەرم بۆباس ئەكەی
هەرلە دارا و سكەندەر، كەی قوباد و ئەردەشێر
یەك بەیەك ئازاو دلێربوون ( ڕەهبەرا ) تاحەزبكەی

كەركوك ١٩٤٤

## سروود بو  قوتابیان

سالی١٩٣٨ بۆقوتابیانی قوتابخانەی سەنگەسەر نوسراوە

لاوانی وەتەن لەخەو هەڵستن    بەمەردی ئازا کۆمەڵ ببەستن
بەعیلم وئەدەب بەئەقڵ وکەمال    وەرنە سەر ڕێگەی تەرەقی و تەعال
مونادی بانگ کا لەناوتان بەدەنگ    وەکو ئەوروپا و ژاپۆن وفەرەنگ
ئەوروپا فەننی گەیشتە ئیعجاز    تاکەی زەلیل بن لاوانی بێ ناز
عیلمی ژاپۆنیش دنیای داگیرکرد    ئێوە لەجەهلا خۆتان مەحو کرد
ئەرز و ئاسمان سەروژێر چیا    هەموی کەشف کرد گەلی ئەوروپا
مەکتەبە ڕێگەی تەرەقی ونەجات    هەوڵی تیابدەن لاوانی ووڵات
لەخەوی غەفڵەت تاکەی هەردەنوون    ئێوە زیندوون یانەخۆ مردوون
جەهالەت بڕوا نۆرەی عیرفانە    وەرن بۆمەکتەب ئازاو مەردانە

## نۆرەی ژیانە

موژدە ئەی لاوم ڕۆژە نەما شـــــەو
دەس دە تەلەفون بانگ کە کورد هەلەو
کوردستان ڕۆژی ڕوناك وپـــــڕ تەو
ئازانە هەرکەس بخوێنێ وەك کەو
ئەی لاوی شیرین ڕۆژە بەسیە خەو
نۆرەی ژیانە تازە نەو بە نەو

شاخی کوردستان قیبلەی ولاّتم
رِووناکی چاوم مایەی حەیاتم
رِوتبەی شاهیم و گەنج وخەلاّتم
هیوای لاوان وجێگەی ئــــاواتم
ئەی لاوی شیرین رِۆژە بەسیە خەو
نۆرەی ژیانە تازە نەو بە نەو

وەك بولبول تاکەی لە وەختی بەیان
ئاه و ناڵەکەم لەناو نیشتمان
تاکەی تینوو بێ باخی هیــواتان
ئاو داشتەی بکەن ئێوە و خوداتان
ئەی لاوی شیرین رِۆژە بەسیە خەو
نۆرەی ژیانە تازە نەو بەنەو

شاخی کوردستان چەنێ رِەنگینە
پڕلە یاقووت و گەنج وخەزێنە
لانەی شێران و باز و شەهێنە
هەربەو هیوایە بژین کوردینە
ئەی لاوی شیرین رِۆژە بەسیە خەو
نۆرەی ژیانە تازە نەو بەنەو

کوردستـان چـاوی هەموو کوردێکە
رۆژی روونـاکی  هەموو مەردێکە
( ڕەهبەرا ) هیوای هەموو گوردێکە
کوردی  دوا کەوتـووم دەست و بـردێکە

ئەی لاوی شیرین ڕۆژە بەسیە خەو
نۆرەی ژیـانە تـازە نەو بەنەو

کەرکوك  ١٩٤٢

# خـــــەت و خاڵـــت

ڕووحەکەم تاکەی خەت وخاڵت گرفتارم ئەکا
شاهی چاوت بۆچ ئەسیری زولفی زیننارم ئەکا
هەڵدەوە سەرپۆشی ڕوو تادەرکەوێ ژۆری منیر
کافری زولفت لەبەرچی مەنعی گوڵزارم ئەکا
نابەڵەد مورغی دڵم ڕووی کردە سەر صفحەی روخت
شمعی روخسارت عزیزم دڵ بریندارم ئەکا
پەرچەم و ئەگریجەکانت صف بە صف وەستاوە لێم
یەك بە یەك قاتل بە دڵمن کێ دێ رزگارم ئەکا
پارەپارە جەرگی خۆم کردە کەباب و ئیستە وا
بێوەفا یارم لەبەرچی روو لە اغیارم ئەکا
بێ قەباحەت دەمکوژێ جانا خودا هەڵناگرێ
کافریش رەحمێ بە حاڵی چاوی خوێنبارم ئەکا
رەوزەیی سینەت لە کافر مەنعە، ئیسلامم ئەمن!
بوٚئیشارەی ( فادخلوها ) مەنع و انکارم ئەکا
مەسئەلەی کوحلی دووچاوت کێ ئەتوانێ حەللی کا
حاشیەی زوڵفت حەواڵەی شەرحی اظهارم ئەکا
قامەتی الفت لە دووری ( رهبەرا ) وا بوٚتە دال
چاوی پڕ فیتنەی نیگاری تازە دووچارم ئەکا

# جارێ نەبوو

جارێ نەبوو ئەم شۆخە بتە روو لە خوداکا
تــەرکی شەڕو ئاشوبی جیهان روو لە وەفاکــا
وەستاوە بە جەللادی دەڵێ روو لە قضـاکـــا
واجەژنەیی قوربانە بڵێن بێت و وەفـــــــاکا

سەرخۆش و پەرێشانم ئەمێستاکە بە مـەستـــــی
دڵ ڕیشە بەدەس چەشمی سیەه، موژەی شستـــی
زیننـــاری دوو زوڵفی لەدڵم داوە بەراستـــــــی
خۆحەشرە وەکو مورغی سەحەر ماچێ عطاکـــــا

وەك سەروی گولستانە لەنێو باغی ئیرەمـــــــدا
وەك بەدری بەدەخشانە لەنێوهەمدەم وهەمتا
وەك خونچەی گوڵ تازە لەنێو باغی حەرەمـدا
پەروانە سیفەت سووتم و لوتفێ بەگەداکا

کێشاویە بەسەر عارزی گوڵ موژژەیی خە نجـــــەر
لایدا کە لەسەر باغی بەیان زولفی معطّـــــــــر
مورغانی چەمەن کەوتەخرۆش هەر وەکو مەحشەر
بێ هۆش و پەرێشانە هەموو یار کە سەماکـــــــا

یەك بۆسەی لێوی كەوەها داغە لەدڵ مـــــــــن
قەد قامەتی رەعنایی نیگار شەتڵە لەدڵ مـن
بێ رەنگی و روخسارەی یار عەكسە لە دڵ مـــــن
( رەهبەر ) مەبەدڵ تەنگ لەیار هەرچی ڕەواكـــا

## ئاگری عەشـــقـت

دڵ لەبۆتەی ئاگری عەشقت دەسوتێ وەك كەباب
إنّ جسمـــي في هواكا ذاب من ســوء العـــذاب
حوسنی تۆشاهە لەعالەم عاشقی رووتە گەدا
أين صبرُ من فتى اذ يشرب كأس الشراب
سێبەری دوو چەتری زولفت سایە بەخشە بۆ فەقیر
ينزوى من يلتجي اذ تحت صدغين الحجاب
ئایەتی حوسنت بەجارێ كافری هێنایە دین
كيف لايسلمُ من لويعرفُ سوء الحساب
حوكمی یەزدان بۆ گەدا لوتفە چ كوشتن بێ چ ژین
كل شئ تحت أمري وهو في ام الكتاب
سەد كەحاجی واخەریكە بۆ تەوافی كەعبەكەت
لم يحج من لم يزر شئ الذي تحت النقاب
( رەهبەرا ) تاكەی بەئومێدی زەكاتی حوسنی رووی
وهي لاتعطيك مالم تبلغ الـ( حدّ النّصاب )

## پڕ ئێشە دڵم

پڕئێشە دڵم والە غەمی هیجر و فیراقـــــــت
سەرخۆشە سەرم مەست و دەبەنگە لە فیراقت
ساتـــــێ نیە ئارامی دڵ وخۆشی  وجـــــوودم
دێوانە سیفەت وام بەکەژ و کێوی  فیراقت
ڕۆژم شەوە شەو وام لەغەمی تــــــاڵیی تۆدا
پەروانە مثل سووتم ئەمێستا لەفیراقت
سیلابی سروشکم کەدەکا هاژە لەســــەر دڵ
وێرانی ئەکـــا  پردی تەحەممول لەفیراقت
مەنعی مەکە( ڕەهبەر) کەوەها غەرقەیی خوێنە
کوژراوی موژەی تۆیە هەموو دەم لەفیراقت

## تەعـاروف چاکە

تەعـاروف چاکە ساقوربـان لەگەڵ ئەم یاری دێرینت
خوا نـاکەردە نەك بێت و ڕەقیب دەست خاتـە  پەرژینت
بەشەو تـاکو سەحەر هەردەم دەرێژم ئەشکی ئاڵ و سوور
لەبەرچی ئەم هەموو جەورە موقـابیل یاری مسکینت

نیە باكم لەتانەی خەڵك ئەگەر بمرم لەهیجرانت

لەبەرچی دەمكوژی ڕووحم كەمن وابیمە بریانت

گوڵم سوچم چ بوو دەستت بەخوێنی عاشقت سوور كرد

كەسەر دانێم كەببمە قۆچی قوربانت

ئەگەر ماچێ كەرەم كەی پێم بەقوربان كەعبە كەچ نابێ

چ نەفسێكی هەیە چاوم تەجامول كەی بەیادینت

هەتاكەی ئەم هەموو جەورە لەگەڵ من ئەی بتی كافر

تەرەحوم كە بە( رەهبەر ) سا، بە عەشق ومەزهەب ودینت

## ئەسیر و بەند

ئەسیر و بەندی نێو زوڵفی نیگارێكم چ عەیارە

وەكو ( یوسف ) لەناو چاهی زەنەخەندانی ( زولە یخا ) رە

ڕەفیقان ئێوە شاهید بن لەگەڵ من دوژمنە دولبەر

لەبەر تەعنەی ڕەقیبی بەد كەوا بێ مەیل وگوفتارە

نظامی خۆم لەعەشقی مەكتەبی ئەودا سەرف كرد وا

كەچی ئێستاكە دەمگاتێ دەڵێ لاچۆ چ بێ عارە

خەراباتی دڵی بردم بەسیحری چاوی مەستی خۆی

كەسێ نەیگوت درێغ بۆتۆ كەبۆچ وا بووی سیاچارە

گوتم ڕەحمێ بكە قوربان بەحاڵی( رەهبەر )ی مەحزوون

گوتی مەعلوومە پیشەی عاشقی رووم شیوەن و زارە

# شەرتە وەك

شەرتە وەك مەجنونی رسوا روو بەكەژ دێوانە بم

رۆژ و شەو عەوداڵی لەیلا هەم دەمی وەحشانە بم

شەرتەوەك فەرهادی كوكەن بێستون لادەم لەبن

گوێ لە شۆڕ و شینی شیرین نەگرم ومەردانە بم

شەرتە بۆ من خەرقە پۆش و دەربەدەر یاهوو بكەم

یەك نەفەس ئارام نەهێنێ خوێن لەچاو، تا چانە بم

شەرتەوەك پەروانە دایم روو بەدەوری شەمعەكەت

ئاگرێ هەڵكەم لەخۆم ئەوسا فیدای جانانە بم

شەرتەوەك قومری لەمل كەم دا یما تەوقی وەفا

یاوەكو بولبول بەسۆزی عەشقەوە مەستانە بم

شەرتەوەك ( ئازەر ) خەریكی بت پەرستی قەومەكەی

پشت بە زیننار ڕابوەستم، نۆبەچی بت خانە بم

شەرتە تا عومرم بمێنێ روو لە تەقوا و دین نەكەم

یاوەكو پیری موغان خۆم حاكمی مە یخانە بم

شەرتە( رەهبەر ) تاقیامەت، كێو بەكێو بخولێتەوە

حەیفە تا مردن كەمن دڵسۆز و سەرسەودا نەبم

# جَنّة الفردوس

( جنة الفردوس ) ە یا خلد، یا نعیم ە یا سەلام ؟
ئەوبەهەشتەی ها لە سینەت، نازەنینەی خۆش غرام
ڕەوزەیی سینەت کەدەرخست ،سەربەسەر بازاڕی دڵ
ئاگری گرت وخرۆشا هەروەکو ڕۆژی قیام
دایە سەر موڵکی عەجەم سەرکردەی سالاری غەم
هاتەدەر بۆشەڕ وەکو ڕۆم وحەبەش بۆئینتقام
من کە پابەندی دوو زولف و چینی ئەگریجەم ئیتر
کەی بەئومێدی ژیانم، جارێکی تر بێتەلام
گە بەچاو فەرمووم دەکات و گە بەئەبرۆ دەرمەکا
ڕەببی چۆن لەم بەینەدا ماوم بەداوی موبتەلام
دڵ لەساحەی مەدرەسەی عەشقا خەریکە مەشق ئەکا
بۆئەوەی فێربێ لەماچی خاڵ و خەت هەروەك نظام
( رەهبەرا )تاکەی وەکو کۆرپە بەشوێنی دڵ کەوی
خۆت مەخنکێنە لەبەحری عەشقی بێ جێ و انتظام

١٩٤٨

# نیشتەی مەیخانەم

نیشتەی مەیخانەو هەم مەی پەرستم
دواکەوتەی کردەی ڕۆژی الستم
ساقی سا وەرە مەستی مەیم کـــــــــە
هەتا بێتەدی ئاواتی مەستم

بێ ساقی ومەی ومەعشوقە بەهەشت

لەلام دۆزەخە لەکاتی هەستم

سەدهەزار گیو و کەی قوباد و جەم

هاتنە ئەم سەرا کۆنەی چاوبەستم

نە سککە وخۆیان ما نە نیشتەجێ

لانەی مۆرانە ، خاکی بەردەستم

ساتێ سەرخۆشی شەرابی سووربم

لەوەعدەی زاهید چاتر پشت بەستم

چاوبەستەی زوهد و تەقوام بۆچیە

مەی ومەعشوقە گەربێتە دەستم

یەزدان لە ئەزەل کەخەلقی کردم

بۆعیلم و زانین نەك ڕا بەدەستم

بەهەشت جێی فەنن و عیرفانە (رەهبەر)

نەك بۆ کەر بڵێی من خوا پەرستم

# شــــە و

دڵ بەدائیم واخەریــــکی شیوەن وگریــــانە شەو

ئەشکی چاوم لێڵ وسوورە هەروەکو سیروانە شەو

سەبرو هۆشم لێ بڕاوە والە هیجران و فیراق

چونکە ئومێدی ویساڵە عاشق ودێوانە شەو

**شەرتە گویٚ نەگرم لە پەندی واعیظی ئەم شارە من**

**چونکە کوژراوم بەتیری دولبەری جانانە شەو**

**زاهیدو سۆفی لەگەڵ من واخەریکی عیشرەتن**

**پیشەیی عاشق وەزیفەی خادمی مە یخانە شەو**

**ڕۆژو شەو مەشغوڵی ساقی وبەزمی بادەی عیشرەتم**

**پێی بڵێن بابیٚ موغەننی صوحبەت و سەیرانەشەو**

**عیززەتی نەفسم نەماوە ڕوو بەڕووی ئەوشۆخە وا**

**ئەی خودا ڕەحمیٚ بەحاڵی عاشقی دێوانە شەو**

**گەر وەکو قومری لەمل کەم دائیما تەوقی وەفا**

**سەیرئەکەی ئەوکافرە هەر مونکیر و بێگانە شەو**

**بابڵێن پیری موغانیش حازری مە یخانەبیٚ**

**یاری شۆخ ونازەنینم هەمدەم و میهمانە شەو**

**بربط و عوود و کەمان و مطرب و چەنگ ونەییش**

**لیٚ بدەن تاکو سەحەر بۆ عاشقی مەستانە شەو**

**بیٚ مەی وساقی هەموو ئەم عالەمە مەستی شەراب**

**( رەهبەر ) یش هەروا غەریقی بەحری بیٚ پایانە شەو**

---

**ئەم چامەیە ساڵی/ ١٩٦٤ لە رادیۆی کوردی کرماشان، لە ریگای بەرنامە بەناوبانگەکەی بەڕێز ( شکراللە ی بابان ) وە خوێندراوەتەوە .**

# بێ کفن

بمکوژە قوربانە، مەمشۆ بێ کفن بم شێرەوە
بۆگەواهی بەرگی حەشرم خوێنی گەش بپژێنەوە
چاوەکەم مەحروومی تاکەی، دڵ ئەسیرو پابەکۆت
شەو لەتاو داخی فیراقت تاسەحەر ئەتلێمەوە
گوڵ بەدەم تاکەی لەکونجی میحنەتا شەو تاسەحەر
دەست بەئاە و ناڵەکەم خوا کەی شەفەق ئەکرێتەوە
کەعبە کەچ نابێ بەقوربان لێم بپرسی دەفعەیێ
لێم بپرسی چۆنە حاڵت شەو بەدەم لەرزینەوە
گاهێ کوشتەی نازو غەمزەم گاهێ کوشتەی دوو برۆ
گە ئەسیری داوی زولف و پەرچەم وئەگریجەوە
شاهی چاوت سەبرو هۆشی لێ بڕیم ئەی نازەنین
هەروەکو مەجنونی شەیدا روو بەکەژ ئەخولێمەوە
یوسفی دڵمت ئەسیری چاهی غەم کرد سا وەرە
وەك زولە یخا زەڕ خەریدەی خۆتم وبمسێنەوە
ئاگری عەشقت لەدڵما وەك بڵێسەی مە نجەنیق
مەر، بەبارانی ویساڵت، چاوەکەم بکوژێتەوە
عاجزو دڵگیرە دولبەر ( رەهبەرا ) دایم لەتۆ
بێ و لەسەر مەم ماچی کەی ئەوسا مەگەر ئاشت بێتەوە

# لەمێرگ و مێرگوزارم چی

کەمن ڕوخساری یارم بێ لە مێرگ و بولبولانم چی
کەمن زولفی نیگارم بێ لەعاقیقی یەمانم چی
کەمن دوو چاوی شەهلام بێ لەئەستێرەی بەیانم چی
کەمن میحرابی ئەبرۆم بێ لەمیحرابی ئیمانم چی
کەمن  شمشادی  باڵام بێ لە عەرعەر یا چنارم چی
کەمن لێوی نیگارم بێ لەسێوی سەرچڵانم چی
کەمن خەندەی لێوانم بێ لە ڕۆشنایی بەیانم چی
کەمن وەعدەی ویساڵم بێ لەوەعدەی زاهدانم چی
کەمن دەرمانی دەردم بێ لەلوقمانی زەمانم چی
کەمن سەروی ڕەوانم بێ لەسەروی بۆستانم چی
کەمن تیغی زوبانم بێ لە طعنە ی جاهلانم چی
کەمن خەرمانی باڵام بێ لەروتبە، یا نیشانم چی
کەدی ( ڕەهبەر ) سەری دانا لەژێر پێدا وتی جانا
وەرە نێو باغەوە، ئیتر لەباغ وبێستانم چی

# حوور و غیلمانم له چی

یار کەڕوخساری ئەتۆم بێ حوور و غلمانم لەچی
تاقی ئەبرۆی تۆم هەبێ قیبلەو موسوڵمانم لەچی
نامەوێ گەربمدەنێ بێ تۆ بەهەشت وقەسرو حوور
باخی خولد و ئاوی کەوسەر وەعد وپەیمانم لەچی
سینەبریان وکەبابم مەجنون ئاسا ئەی نیگار
وا خەریکی بێستوونم شین و گریانم لەچی
سوحبەتی تۆم گەرهەبێ بۆمن جەهەننەم جەننەتە
دەنگی تۆم گەربێ لەگوێ مورغی غەزەل خوانم لەچی
دڵ لەحەسرەت نەونەمامت کەوتە زیندانی ئەلەم
وەسڵی تۆ بۆ من ژیانە لوتف وئیحسانم لەچی
غەرقی خوێنە، مورغی دڵمە، وا بەتیغی دوو برۆت
با نیثاری مەقدەمت کەم جانی جانانم لەچی
گەر ( قەدەم ڕەنجە ) بکەی بۆ سەر گلارەی دیدەکەم
ڕۆژی جەژنە گیانەکەم، جا نووری چاوانم لە چی
کفری زولفەینت کەلادا نوری ئیمان کەوتەدەر
هەردوولای من ڕەحمەتن جا کفرو ئیمانم لەچی
بێ ، نەوا( رەهبەر )لەتاوا کەوتە سەحرایی عەدەم
بولبول وپەروانە ئاسا سۆزو سووتانم لەچی

# گیرۆدەی چاو شەهێنم

چاوەمەستی نازەنینم      گیرۆدەی چاو شەهینم
چ خوابەرداره قوربان      تێر بەدڵم نەتبینم

نەخۆشێکم لەسەرجێ      بانگ کەن دکتۆرم بۆ بێ
بڵێن بەوکافرە یارە      نەچی ،لەسوێ دا دەمرێ !

ئەسیرو دڵ بەندی تۆم      سووتاوی چاوی جادووم
سەرپۆش لەڕووت هەڵدەوە      تاقەتی هێزی ئەژنۆم

دەمێ تەشریف کە لامان      رووحم لەڕێتەقوربان
لەگوێ مەگرە لۆمەی کەس      باعالەم بێنن ناومان

سەبرم پێ نەما ئەی دڵ      پیشەم گریانە ئەی گوڵ
ئەقڵ وهۆشم پێ نەما      خوا هەڵناگرێ شل ومل

( رەهبەر )موتیعی تۆیە      فەرمایشتت بەجێ یە
هەرئەمرێکی کەدەیکەی      سەرومالم لەرێ یە

# مطرب  له گەڵ ساز و نەی

مطرب له گەڵ ساز و نەی
هیوام بەخوای نەمرو حەی

وردە وردە بۆم بلێ دەی
زامی سەختم سارێژکەی

دەڵێن سوبحەی بەهارە
پیشەی عـاشقی هەژارە

وەعدەی بۆسەو کەنـارە
عەودالی ڕووی مەعشوقەی

تـاقەخونچەی نێوگـــولاَن
بولبول مەستی سەرچــلاَن

دەکرێتەوە بەربەیـــــــان
ئـاهو نـالەی وەکـــــو نــەی

دوکتۆر وەرە سەرینـــــــــم
دەوام کە  تـا بمێنــــــم

بیمـــــــاری چاو شەهێنــم
ڕەقیبم  پێ شادنەکـــــەی

ئەمڕۆ فەسڵی گولاَنـــە
بڵێن بەو شۆخە جوانە

جێ ماچ ودەست لەملانـــــــــە
تەشریف کـاتە بەزمی مەی

غەرییێکم لەم شارە
بڵێن بەوکـافرە یـارە

جێگەم گۆشەوکەنـارە
ئۆبـاڵی من بەئەستۆی

